


حكومەتی هەرێمی كوردستان – عێراق

وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی

زانكۆی سلێمانی – كۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت

قۆناغی یەكەم

# تۆپی پێ

**ئامادەكردنی :**

شنیار محمود عارف

**گروپ :** B

**بەسەرپەرشتی:**

د.ڕاستی نوری

2021 – 2020

## تۆپی پێ

تۆپی پێ یان تۆپانێ (بە ئینگلیزی: football) گرنگترین وەرزشی جیهانی نوێیە، دوو یانە لە یەک یاری بەشدارن هەریەکەکیشیان بە مەبەستی بردنەوە دەیانەوێ گۆڵ لە یانەی بەرامبەریان تۆمار بکەن وە ئەو یانەیەی زۆرترین گۆڵ تۆمار دەکات، دەبێت بە براوەی یاری لەم یارییەدا هەر تیپێک لەناو یاریگا لە ١١ یاریزان پێکدێت.



یۆنانیە کۆنەکان لەکاتی یاریکردنی تۆپی پێ

### تۆپی پێ چییە؟

11یاریزان لە لایەکەوە بەرامبەر بە 11 یاریزانی تر شتێکی ئاساییە 1گۆڵچی لەملا 1 گۆڵچی لەولا، کەسێک لە نێوەندا ناوبژیوانیان دەکات، بە فیکەیەک ئاگاداریان دەکاتەوە کەی بوەستن کەی بجولێن، هەمان ئەو کردە فیزیکی و فەرمانییەی کە بافلۆفی پزیشکی دەروونی ناودار لەگەڵ سەگەکەی دەیکات کاتێک دەیەوێت کۆنترۆڵی جووڵەکانی بکات بە زەنگ و بە تیشکی گلۆپێک ئاگاداری دەکاتەوە، هەر کاتێکیش ئەو ژمارە یاریزانە لە فەرمانەکانی ئەو دەرچوون و سەرکێشییان کرد ئەوا سزایان دەدات، بە دوو ڕەنگ کارت یەک زەرد ئاگادار کردنەوەی سەرەتایی و سور ئاگادار کردنەوەی کۆتایی، هەموو ئەم دۆخانەش کە دروست دەبن پەیوەستن بە یەک شتی خڕەوە ئەویش ناوی تۆپە

که له نێوان هەردوولادا دێت و دەڕوات تا دواجار ئامانجەکەی پێ دەپێکرێت که ئەویش جێگیر کردنێتی له تۆڕی یەکێک له دوو گۆڵچییەکەدا.

ئەوەی باسم کرد پەیوەسته بەو زانستەوە، بەڵام من باسی کەسێکم نەکرد که ئەو له دەرەوە نزیک هێڵی یاریگا دەوەستێت، ناوی ڕاهێنەرە، ناوەکەی به خۆیەوەیە، ڕاهێنەر واتا ڕاهێنان به خەڵکانێک دەکات تا وایان لێ بکات ئەوەی ئەو دەیەوێت و پلانی بۆ داناوە جێبەجێی بکەن، کەواته له نێو یاریگای 100 مەتری لاکێشەدا چی ڕوو دەدات له دیدگای ئەو کەسەوە سەرچاوە دەگرێت، به واتایەکی تر ئەوانەی نێو لاکێشەکه وەک داشی شەترەنج ئەو دەیانجوڵێنێت، ئیدی ڕاهێنەر هەیە 4 ـ 3 ـ 3 دایان دەنێت هەیە 3 ـ 4 ـ 3 دایان دەنێت هەیە 3 ـ 5 ـ 2 هەیە 4 ـ 4 ـ 2 هەشە 4 ـ 2 ـ 3 ـ 1 ڕاهێنەریش هەیە 4 ـ 1 ـ 4 ـ 1 یاری دەکات هەشە وەک هێرێرای ئەرجەنتینی 9 ـ 1 یاری دەکات ئەو پلانەی بەرامبەر تەواوی پلانەکانی تری جیهان وەستاوەتەوە و ناوی کاتیناتچۆیە. کەواته ڕاهێنەر ڕۆحی تیپە، شۆفێری پاسێکه دەتوانێت بیگەیەنێته دوا ویستگەی ئاسوودەیی، هەروەک دەشتوانێت بیکات به کەندەڵانێکدا و هەموو شتێک کۆتایی پێبهێنێت، بەڵام ئەم کەسەش چۆن و به چ شێوەیەک و له کوێوە هات و بوو به سەرکردە و ڕۆحی ئەو تیمە؟ بێگومان کەسێک یان دەستەیەک هەن له دوای دەست نیشان کردنی ئەوەوە، کەواته دۆخەکه پەیوەست نییە به تەنها ئەوەوە، بەڵکو خەڵکانێکی تریش هەن له سەروترەوە، لێرەدا تۆپی پێ له زانستەوە ڕێچکه و ڕێڕەو دەگۆڕێت بۆ دوو دونیای جوودا له یەکتر، لەمەشدا وشەی ململانێ دێته پێش دوو دونیا یەکێکیان پەیوەسته به عەشق و خۆشەویستی بۆ یانەیەک ئەوی دییان دونیای پارە و سەرمایه گوزارییە. ئەمڕۆی تۆپی پێ خەریکه بۆ ئەبەد له عیشق و خۆشەویستی جوودا دەبێتەوە، زانست و هونەر بەتەواوی له ژێر دونیای پارە و سەرمایه گوزاریدا له ناو دەچن، ئەمەش خاڵی سەرەکی گەورەترین کتێبی فیکری سیاسی بیرمەندی گەورەی ئەڵمان (کارڵ مارکس)ە کاتێک له سەرمایەداریدا باس له بچووک بوونەوەی مرۆڤ و مرۆڤ بوون دەکات له ژێر ددانی مشارەکانی سەرمایەداریدا.



دوو نموونەی زۆر ڕوون باس دەکەم بۆ ئەوەی درێژە بە نووسینەکە لەوە زیاتر نەدەم و تا خوێنەریش تێ بگات دەمەوێت چی بڵێم، ڕووبەڕوو بوونەوەی پاریس سانجێرمان و بایرن مینشن لە وەرزی 2017 ی چامپیۆنس لیگدا، بە یاری مەرگی سەرمایە یان خۆشەویستی هەژمار کرا، بێگومان پاریس 3 ـ 0 براوە بوو، گاری نیڤڵ-ی کاپتنی پێشووی مانچستەر یونایتد هاوڕا لەگەڵ بۆچوونێکی بەندە کە پێش یارییەکە بە نووسین بڵاوم کردەوە، ئەو نووسی؛ بایرن بە عەشق و ڕێزی یاریزان دۆڕا بەرامبەر بە پاریسێک کە بە پارە تیمێکی سەردەمیانەی کێبڕکێکاری دروست کردووە.

نموونەی دووەم ڕیاڵ مەدرید بەرجەستەی دەکات ئەو یانەیەی لە مێژووی تۆپی پێ و لە گەورەترین پاڵەوانێتی یانەکاندا کە چامپیۆنس لیگە، سەرکەوتووترین یانیە، لەم یانەیەدا لە سەردەمی سانتیاگۆ بیرنابیۆوە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردووە تا ئەمڕۆمان، یانەیەکە نە لە سەر ڕاهێنەر دەوەستێت نە لە سەر یاریزان و نە لە سەر هیچ، تەنها و تەنها هەنگاو بۆ پێشەوە هەڵدەهێنێت، چونکە لەو یانەیەدا بەرژەوەندی هەیە، کە بەرژەوەندی نەما، وەک پەیوەندی نێوان دوو هاوبەش یان ژن و مێردێک ئەوانیش هەموو شتێکیان کۆتایی دێت، هەریەکە و بە ڕێی خۆیدا دەڕوات، ئەمەش وای کردووە ڕیاڵ مەدرید سەرکەوتوو تر بێت، چونکە بەرژەوەندی هاوبەش دەخوێنێتەوە نەک سۆز و خۆشەویستی، سەرەڕای ئەوەش یاریزانان خەون بە پۆشینی درێسەکەیەوە دەبینن، ئەگەر چی چارەنووسی زۆرێک لەوانەی پێش خۆشیان لە بەر چاوە، بەڵام عیشقیان بۆ یانەکە وەک عیشقی ئەو یاریزانانەیە کە یانەکانیان بە گریان و ئاهەنگ گێڕانەوە ماڵئاواییان لێ دەکەن، کەواتە تەنها پرسیارێک هەیە ئەویش ئەوەیە: تۆپی پێ چییە؟.

## مێژووی نادیار

تا ئێستا دیار نیە یەکەم جار یاری تۆپی پێ لەکام وڵات ئەنجام دراوە بەڵام سەرچاوەکانی مێژوو ئەوە دەردەخەن کە ئەم یاریە لە ووڵاتانی میسر و چین و یۆنان و بریتانیا لە ووڵاتی میسر مێژووی تۆپی پێ دەگەڕێتەوە ٣٠٠٠ ساڵ بەر لە ئێستایە کاتێ یاریزانان بە تۆپی چەرمی بزن یاریان دەکرد وە وێنەکێشانی میسرِی وێنەی ئەم یاریزانانەیان لەسەر پەرستگا و شوێنەکانی میسرِ کێشاوە وە چینیەکانیش بەر لە ٢٥٠٠ز ئەم یاریەیان کردووە وەناویشیان ناوە تشو چوو وەهەروەها مێژووناس و ئەفسانەی یۆنانی هیرۆمیس لە بەشێ نووسراوەکانی باسی لەیاری کردنی سەربازە و سەرکردە یۆنانیەکانی کردووە کە بۆ توانای جەستەیی ئەم یاریەیان کردووە بەڵام لەبەر ئەوەی تا ئێستا هیچ بەڵگەیەک نیە بی سەلمێنێت کە لەکام وڵات کراوە بەڵام ئەوەی سەرنج بێت بەهۆی ئەوەی یەکەم تیپ لە بریتانیا دامەزرا کەناوی شیفێڵد یونایتد کە تائێستا ئەم یانەیە ماوە کەلەساڵی ١٨٥٧ز دامەزرابوو بۆیە بریتانیا بەوڵاتی دایکی تۆپی پێ ناسراوە وە لەسەرەتای هاتنی تۆپی پێ لەلایەن دەسڵات دارانی ئینگلتەراوە دژایەتی کرا بەتایبەتی پاشای ئینگلتەرا ئیدوارد کە فەرمانی دا هەرکەسێ ئەم یاریە بکات دەبێ دادگایی کرێت دواتریش هەر لە ئینگلتەرا دەستکاری یاساکانی تۆپی پێ کرا بەمەبەستی بەرەوپێشچوونی یاریەکە نموونە لە ساڵی ١٨٦٢ز لە قووتابخانەی بێرمینگهام لە ئینگلتەرا یاساکان دەستکاری کران لەلایەن چاڵز ترینگ، وە لە ساڵی ١٨٦٩ز یاسایەک دەرچوو کە نابێ لەیاری تۆپی پێ تۆپ بەدەست بگیرێت

## کاتی یاریەکان

- یاری لە دوو گێم پێکدێت کە هەر گێمێکیان لە ٤٥ خوولەک پێکدێت
- یەک پشوو هەیە لە یاری ئەویش لەنێوانی گێمی یەکەم و دووەمە کە ١٥ خوولەکە

## یاساکان

تا ئێستا ١٧ یاسای سەرەکی لە تۆپی پێ هەن کە لەلایەن IFABەوە داڕێژراون

یاسا بنەڕەتیەکان

نابێ یاریکەر دەست لە تۆپەکە بدات لەکاتی هۆشیاربوون ((واتە بەئدقەست بێ))، تەنیا گۆڵپارێز بۆی هەیە تۆپ بەدەست بگرێت ئەویش لە شوێنی خۆیدا

- پاڵنان بەیاریکەری بەرامبەر دەبێتە هەڵە (فاول) و سزا دەدرێت
- سزای یاریەکە لە دوو کارت پێکدێت، دوو کارتی زەرد دەبێت بە سوور زەرد یاریکەر دەچێتە دەرەوە وە دادوەری یاریەکە لەکاتی هەر ڕووداوێک بۆی هەیە کارتی سوور بە جارێک بەرز بکاتەوە
- گەر تۆپ لەلایەن تیپێکەوە کەوتە دەرەوە ئەوا تۆپەکە دەدرێتە تیپی بەرامبەر «یان تیپەکەی تر»
- لەکاتی گۆڵ تۆمار کردن تۆپەکە لە ناوەندنی یاریگا دەدرێتەوە بەتیپی گۆڵلێکراو و بە فیکەی دادوەر یاری دەست پێدەکاتەوە
- لەکاتی فیکە لێدانی ناوبژیوان دەبێ سەرجەم یاریزانانی بەرامبەر هۆشدار بن گەر وا نەبێت دەبێت ناوبژیوان یاری ڕاگرێت، بە هەمان شێوە دەبێت داوەرەکانی یاریگا و دەرەوەی هێڵیش ئاگاداری ئەم کردارە بن
- نابێ یاریکەران نارەزای و تانە لە بریارەکانی دادوەر بگرن لە نێو یاریگادا بەپێچەوانەوە دادوەر بۆی هەیە بە کارتی زەرد یان سوور سزای بدات
- نابێ یاریکەر هیچ شتێکی پێ بێت یان بە لەشیەوە بێت کە ببێتە هۆی بریندار بوون یان ئازاردانی یاریکەرانی تیپی بەرامبەر
- لەکۆتایی یاری دادوەر فیکەی کۆتایی هاتنی یاری لێدەدات و هیچ ڕووداوێک دوای ئەمە هەژمار ناکرێت بەڵام دادوەر دەتوانێت کارت بدات بەیاریکەرەکان بەهەرهۆیەک بێت.
- لە ئێستا لە ناوەڕاستی یاریگا لە کاتی سەنتەر شکاندن دەبێت تەنها یەک یاریزان سەنتەر بشکێنێت.
- ئەم یاسایانە بۆ یاریگای ١١ یاریزانی و ٦ یاریزانی بەکاردێت

- له ئەگەری وتنی وشەی نەشیاو له دەستەی ڕاهێنەران و یاریزانان، ناوبژیوانی سەرهێڵ(لیژنه) سەرپشکه له ئاگادارکردنەوەی ناوبژیوان

## ناوبژیوان

یاری تۆپی بەشێوەیەکی گشتی پێ پێکدێت له ٤ ناوبژیوان

## یانه

یانه یاخووت تیپ پێکدێت له:

- سەرۆک یانه - یاریزان - ڕاهێنەر - یاریدەدەری ڕاهێنەر - وەرگێڕ - پزیشک



یاریگا پێش دەستپێکی یاری

## یاریزانان

لەیاری تۆپی پێدا ١١ یاریزان یاری دەکەن له هێڵەکانی گۆڵپارێز و بەرگری و ناوەند و هێرشبەر یاری دەکەن وە تەنیا گۆڵپارێزبۆی هەیه تۆپ لەشوێنی دیاری کراوی خۆی تۆپ بەدەستەوە بگرێت، له یاری فەرمی دا هەر تیپێک دەتوانێت سێ گۆڕانکاری ئەنجام بدات وە له یاریگای تاتان پێک دێت له ٦ یاریزان، گۆڵپارێز و بەرگری و ناوەند و هێرشبەر وە گۆڵپارێز دەبێت به هەڵدانی تۆپ بۆ دەرەوەی هێڵەکەی پاس بدات به هاو تیمەکانی

## هەڵەی یاریزان

هەڵەکرن لەیاری تۆپی پێ زۆرن لەوانە:

- گرتنی یاریزان یان ڕاکێشانی درێسی
- لێدانی یاریزان بە دەست یان بە قاچ
- نابێ یاریزان لەکاتی یاریکردن درێس داکەنێ ئەگینا لەلاین ناوبژیوانەو کارتی پێ دەدرێت
- ڕەخنە گرتن لە بڕیارەکانی ناوبژیوان
- هەڵەی بەدڕەوشتی لەوانە تفکردن

## سزای هەڵە

گەر یاریزانێ هەڵە بکات لەیاری تۆپی پێ ئەگەری ئەوەی هەیە لەلایەن ناوبژیوانەوە کارتی زەردی بدرێتێ یان کارتی سوور

- گەر یاریزانێ دوو کارتی زەردی وەرگرت یەکڕاست ئەم کارتە دەبێتە سوور دەبێت ئەم یاریزانە بچێتە دەرەوەی یاریگا
- گەر یاریزانێ یەکسەر کارتی سووری لەلایەن ناوبژیوانەوە بۆ بەرزکرایەوە بەهەر هەڵەک بێت دەبێ بچێتە دەرەوەی یاریگا



## یاریگای تۆپی پێ




- درێژی یاریگای نێودەوڵەتی ١٢٠ مەترە بەڵام دەتوانرێ کەم کرێتەوە تا ٩٠ م وە پانی یاریگا دەتونرێت لەنێوان ٩٠–٤٥ م بێت
- پانی گۆڵ زۆرتر لە ٧مەتر وە بەرزیشی زۆرتر لە ٢ مەترە
- دووری گۆڵ لە هێڵی لێدانی سزا ١٨ یاردەیە

## گرنگترین پاڵەوانیەتیەکانی تۆپی پێ

- جامی جیهانیی فیفا بۆ هەڵبژاردەکان
- جامی جیهانی یانەکان
- یاریە ئۆلۆمپییەکان
- خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەورووپا

## باسی یەکێک لە گرنگترین پاڵەوانێتیەکان دەکەین:

## جامی جیهانیی فیفا



جامی جیهانیی فیفا 1978

جامی جیهانی فیفا ئەم پاڵەوانییەتییە دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەی ڕۆبێر جۆردانی فەڕەنسی کە یەکەم سەرۆکی ڕێکخراوی فیفا بوو کە پێشنیازی ئەوەی کرد کە پاڵەوانییەتییەک بکرێتەوەکە پاڵەوانانی سەرجەم کیشوەرەکان لەخۆوە بگریت کە دواتر لەلایەن جۆل ڕیمیەی فەڕەنسی بەتەواوی بڕیاردرا کەلەساڵی ١٩٣٠ یەکەم پاڵەوانییەتی بۆ وڵاتان ئەنجام بدرێت، تائێستا ئەم پاڵەوانییەتییە ٣٢جار ئەنجام دراوە دواین پاڵەوانییەتیش لە ڕووسیا بوو کە هەڵبژاردەی فەڕەنسا بوو بە پاڵەوان.

## پێشەکی جامی جیهانی

مۆندیال لە ١٩٣٠ەوە ئەنجام دراوە، تا ئێستا ٢٠٤ تیپ پاڵاوتن دەکەن و ٣٢ تیپ سەردەکەون، پاڵەوانی ئێستا، پاڵەوانی سەرجەم قارەمانییەتییەکان: بڕازیلە کە (٥) جار لە ١٩٥٨، ١٩٦٢، ١٩٧٠، ١٩٩٤ و ٢٠٠٢)دا بردوونییەتییەوە. ئیتاڵیایش لە خانەی دووەمە و ٤ جار لە ساڵانی (١٩٣٤، ١٩٣٨، ١٩٨٢، ٢٠٠٦) جامەکەی چنگ خستووە، ئیتاڵیا تاکە هەڵبژاردەیە کە دوو جاری لەسەرییەک جامەکەی بردووەتەوە. دیوچلاندیش لە دوای بڕازیل و ئیتاڵیا دێت و ٣ جار ناسناوەکەی لە (١٩٥٤، ١٩٧٤، ١٩٩٠)دا بردووەتەوە.

جامی جیهانی، پێشبڕکێیەکی تۆپی پێیە و یەکێتیی تۆپی پێی جیهان (فیفا) ڕێکی دەخات، لە ١٩٣٠ەوە (جگە لە ١٩٤٢ و ١٩٤٦ کە بە هۆی جەنگی دووەمی جیهانەوە ساز نەدرا) چوار ساڵ جارێک ئەنجام دەدرێت.

لە جامی جیهاندا، ئەو ٣٢ تیپەی بەشدار دەبن، بەسەر ٨ گرووپدا بڵاو دەبنەوە، کە هەر گرووپێک چوار هەڵبژاردەیە و لەو گرووپانەیش ٢ تیپ بۆ قۆناغی ١٦ سەردەکەون.

یارییەکانی جامی جیهانی لە لایەن زیاتر لە ٢٠٨ کەناڵی جیهانییەوە وەشان دەکرێت، بە شێوەیەک کە بینەرانی یاریی کۆتایی مۆندیالی ٢٠٠٦ی نێوان ئیتاڵیا و فرانسە گەییشتە میلیارد و نیوێک بینەر و ئەوەیش ژمارەی پێوانەیی بوو، هەروەها بە کۆی ٦٤ یارییەکە، زیاتر لە ٤٠ میلیارد کەس بینەر بوون.

١- یەکەم جامی جیهان/ ٢ – پەرەسەندنەکانی مۆندیال/ ٣ – جامی قارەمانییەتییەکە/ ٤ – ڕێگەی گەییشتن بۆ جامی جیهان/ ٥ – هەڵبژاردنی وڵاتی میواندار/ ٦ – تیپە سەرکەوتووەکانی مۆندیال/ ٧ – سەرژمێری و ژمارەپێوانەییەکان، کە بریتییە لە گۆڵکارانی خولەکە و ئەو یاریزانانەی زۆرترین گۆڵیان لە مۆندیالەکاندا تۆمار کردووە.

## یەکەمین جامی جیهان

یەکەم یاریی نێونەتەوەیی لە ١٨٧٢ لە نێوان (ئینگلاند و سکۆتلەندا) بوو، لەوە بە دوا یاریی تۆپی پێ هاندەرێکی زۆری لە دەور کۆ بووەوە، ئەو یارییە بە شێوەیەکی فەرمی چووە نێو پێشبڕکێی ئۆلیمپیی ١٩٠٠ـەوە، بەڵام زیاتر یارییەکی نمایشسازی بوو، نەک ڕکابەردار.

لە دوای ئەوەی کە لە ١٩٠٤ یەکێتیی تۆپی پێی جیهان لە فرانسە دامەزرا، لە ١٩٠٦داهەوڵێک درا کە پاڵەوانییەتییەکی نێونەتەوەیی لە نێوان نەتەوەکانی دەرەوەی بەشداربوو لە ئۆلیمپی ساز بدرێت و لەوە بە دوایش چەند پاڵەوانییەتییەکی نێونەتەوەیی ڕێک خران، کە زیاتر لە نێوان یانەکاندا بوو، پاشان لە ئۆلیمپیادی هاوینەی ١٩٢٠دا تۆپی پێیش بەشداریی پێ کرا و لە نێوان ١٤ هەڵبژاردەدا، بەلژیکا میدالیای زێڕینی بردەوە.

لە ١٩٢٨دا فیفا بڕیاری دا کە لە دەرەوەی ئۆلیمپیاد، قارەمانییەتییەکی نێونەتەوەیی بکاتەوە، بۆیە لە یادی سەد ساڵەی سەربەخۆی ئۆرەگوایدا فیفا بڕیاری دا یەکەم جامی جیهان لەو وڵاتەدا ڕێک بخرێت، کە ئەوکات (جۆڵ ڕیمییە) سەرۆکی بوو، بەڵام ئۆرەگوای بۆ وڵاتە ئەورووپاییەکان دوور بوو، بۆیە تا دوو مانگ پێش مۆندیال، وڵاتە ئەورووپاییەکان تیپەکانی خۆیانیان نەنارد، لەو مۆندیالەدا ١٣ هەڵبژاردە بەشدارییان کرد، کە چوار لە ئەورووپا، ٧ لە ئەمەریکای باشوور و دوویش لە ئەمەریکای باکوور. یەکەم گۆڵ لە مۆندیالدا یاریزانی فرانسەیی (لۆشین لۆرین) تۆماری کرد. لە یاریی کۆتایی یەکەم مۆندیالیشدا کە ٩٣ هەزار کەس لە یاریگەی مۆنتیڤیدیۆی پایتەختی ئۆرەگوای ئامادە بوون، ئۆرەگوای ٤ – ٢ گۆڵ لە ئەرژەنتینی بردەوە و بووە یەکەم قارەمانی مۆندیال.

### پەرەسەندنەکانی پاڵەوانییەتییەکە

پاڵەوانییەتییە سەرەتاییەکانی مۆندیال زۆر گران بوو، چونکە لەو کاتەدا کێشەی گواستنەوە لە نێوان کیشوەرەکان و بوونی جەنگ هەبوو، بۆیە لە لە ١٩٣٤ و ١٩٣٨دا بەشێکی کەم لە هەڵبژاردەکانی ئەمەریکای باشوور گەشتی ئەورووپایان کرد، هەروەها هەردوو پاڵەوانییەتیی ١٩٤٢ و ١٩٤٦ بە هۆی شەڕەوە ڕێک نەخرا. لە دوای ئەوەی وڵاتانی بریتانیا لە ١٩٢٠ـەوە لە فیفا کشابوونەوە و ڕەتیان کردبووەوە لەگەڵ ئەو تیپانەدا یاری بکەن کە لە جەنگی یەکەمی جیهاندا لە بەرەی شەڕەکەیاندا بوون، بۆ یەکەمجار لە مۆندیالی ١٩٥٠دا بەشداریی مۆندیالیان کرد، لەو مۆندیالەدا ئۆرەگوای جارێکی دیکە گەڕایەوە و بۆ جاری دووەم جامەکەی بردەوە. بە گشتی لە مۆندیالی

١٩٣٤ـەوە تا ١٩٧٨، ١٦ تیپ بەشدارییان لە مۆندیالدا کرد (جگە لە ١٩٣٨ و ١٩٥٠ کە چەند تیپێک کشانەوە)، لەو مۆندیالانەدا باشترین تیپەکانی جیهان بەشدارییان دەکرد.

لە ١٩٨٢دا تیپە بەشداربووەکانی مۆندیال بۆ ٢٤ هەڵبژاردە زیاد کرا و لە ١٩٩٨یش بۆ ٣٢ هەڵبژاردە زیاتر کران، ئەوەیش وای کرد بەشێکی زیاتری تیپەکانی کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمەریکای باکوور بەشداری مۆندیال بکەن، بەڵام کورسیی ئۆقیانیا زیاد نەکرا.

١٩٨ هەڵبژاردەی وڵاتەکان، بەشدارییان لە پاڵاوتنەکانی گەییشتن بە مۆندیالی ٢٠٠٦دا کردبوو، کە وڵاتانی بۆتان، تەیموری ڕۆژهەڵات و دورگەی مانگ) بەشدارییان پێ نەکرا، کە دوو هەڵبژاردەی دووایییان لەو کاتەدا ئەندامی فیفا نەبوون.

## ڕێگەی گەییشتن بۆ جامی جیهان (پاڵاوتن)

لە ١٩٣٤ـەوە بە شێوەیەکی ڕێکخراو، پاڵاوتن بۆ گەییشتن بە مۆندیالی دەکرێت، کە لە ٦ ناوچەی جیهاندا دەکرێت (ئەورووپا، ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمەریکای باشوور، ئەمەریکای باکوور و ئۆقیانیا)، کە ٢ یان ٣ ساڵ پێش مۆندیال پاڵاوتنەکان دەست پێ دەکەن. هەر کیشوەرێکیش ژمارەی کورسییەکانیشیان دیاری کراوە. بە شێوەیەک کە (ئەورووپا ١٣ کورسی، ئاسیا، ٤ و نیو، ئەفریقیا ٦ کورسی، ئەمەریکای باشوور ٤ کورسی و نیو، ئەمەریکای باکوور ٣ و نیو، ئۆقیانیا نیو کورسی) کە ژمارەیان دەگاتە ٣٢ هەڵبژاردە. پێشتر پاڵەوانی مۆندیال، یەکسەر دەگەییشتە مۆندیال، بەڵام لە ٢٠٠٦ـەوە ئەو یاسایە کاری پێ نەکرا


سەرچاوەکان:

1. کتێبی (تۆپی پێ)، لە نوسینی سامان عبدلله بەفریکانی
2. مـێژووی تـۆپی پـێ، نوسینی محمد احمد، لە سایتی (www.kurdistantv.net)
3. تۆپی پێ چییە، نوسینی دانەر ئەسڵان، لە سایتی (knwe.org)
4. ktebstan.com